## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: فتبینوا

نووسینی: کاروان کمال الكردي

ساڵی: ١٤٤٣ھ



ناونیشانی کەناڵ لە تێلێگرام

T.ME/KARWANKAMALL1

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

# پێشەکی

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله، وصحبه، أما بعد:

الله تبارك وتعالى دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦ ﴾ الحجرات [٦]

بەشێک لە زانایان دەڵێن : (فتثبتوا) وەک ئیمامی الطبري لە تەفسیر ئاماژەی پێکردووە.

هۆکاری دابەزین: ئەو ئایەتە لە سەردەمی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دابەزی بۆسەر کێ بۆ سەر هاوەڵان واتە بۆ سەر باشترین سەدەی ئیسلام، هۆکاریش ئەوەبوو رسول الله یەکێک لەهاوەڵان دەنێرێت بۆئەوەی زەکات کۆبکاتەوە بەناوی (ابن أبي معيط الوليد بن عقبة)، لەگەڵ یەکێک لەوانەی زەکاتی لێدەسێنێت ناخۆشیەکان هەبووە لەسەردەمی جاهیلیدا ، سەرەڕایی ئەوەی زەکاتی پێدەدا بەڵام کە دەگەڕێتەوە لای رسول الله دەڵێ: زەکاتی نەدا و واو وا ، ئینجا پێغەمبەر زۆر تورە دەبێت کاتێ بانگی ئەکات دواتر دەردەچێت کە بەو شێوە نیە بۆیە خوای تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند.

واته لێرەدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕاستەوخۆ توثیقی ئەوکەسەی کرد بێ لێکۆڵینەوە بۆ الله فەرمانی کرد بەو وە بە هەموو ئیمانداران کەوا ڕاستەو بڕوا مەکەن تاوەکو لێی دەکۆڵنەوەو دڵنیا دەبن.

هەر بۆیە لەشەرعیشدا قازی بۆی نیە حوکم بدا هەتا گوێ لە (خصمەکان) دەگرێت واتە هەردوو لا.

وە ڕوونیشە لەقورئان هاتووە لەبارەی(داود) عليه السلام تاقیکردنەوە کاتێ دوو تەڕەف دەچنە ژوورەوە بۆ سکالا بێ گوێدانە هەردوو لایەن بڕیار دەدات.

لێرەشدا پێویستە تۆی خوێنەر لەوە بگەی کە ئەگەر دڵنیابوون و لێکۆڵینەوەو وورد بوونەوە ئەوکات بەو شێوە بێت کە بەنمونە ڕوونی دەکەینەوە بۆئێستا زۆر پێویستترە ،

ئەو باسە زیاتر (مصطلحاتي الجرح والتعديل) م تێدا بەکارهێناوە چونکە خوودی ئەو زانستە بۆ ئەوەیە تاوەکو دوای لێکۆڵینەوەو ووردبوونەوە ئینجا بڕیار لەچارەنووسی ئەو فەرموودەیان آثرە بدرێ.

بێگوومان( علم ) واتە ( دین ) تابعی بەڕێز (محمد بن سيرين) دەفەرموێت : "ئەم علمە دینە بۆیە بزانن وە سەیربکەن کەوا لەکوێی وەردەگرن ، یان چۆن وەری دەگرن".[١]

[١] ئەم قەولە مشهورە: [ابن ابي حاتم لە الجرح والتعديل ، تقدمة معرفة كتاب الجرح والتعديل ، وە مسلم لە مقدمة الصحيح و ابن عدي لە الكامل و ابن حبان لە المجروحين].

بۆیه پێویسته بزانین چۆن و بەچ ڕێگایەك ئێمه دین و علم كه پێک دێ له قورئان و حدیث و آثری سلف وەربگرین.

ئەو كاتەی كەوا (الجرح والتعدیل) سەری هەڵدا وەك بەشێک لەزانایان دەڵێن یەكەم كەس تابعی بەڕێز(الشعبي) بوو كەوا قسەی لەسەر (رجالی حدیث) كرد واته لەنێو یەكێک لەباشترین سەدەكانی ئیسلام كه (تابعین) و دوای هاوەڵان بووە فكیف بۆ سەردەمی شرار الناس و دجاجله و كەوا (تحریف و تأویلی باطل) بۆ دەقەكانی دین وەک قورئان و حدیث دەكەن، ئەوكات چەند گروپ و تاقمێكی مبتدع وضال سەریان هەڵدا بوو بەهەموو ئیمامەكانی ئەوكات شەو و ڕۆژ وەڵامیان ئەدانەوە، ئەگەر ئەوكات چەند گروپێكی وەك: (خەوارج وجهمي و مرجئي و معتزلي و القدریة الخ.. ] بووبن ئینجا بەم شێوە ووردو دەقیقه تحقیقان له سەرچاوەی هەڵقوڵانی علمەكەو كەسەكان دەكرد (فیكف) بۆ ئێستا كەوا هەریەک لەو گرووپانه ئەولاد ونەوەیان لێ پەیدا بووەو ڕێچكەیەكی ئەوانیان گرتووە.

بەیارمەتی الله تبارک وتعالی ئەوە دەسەلمێنم كەوا تەنانەت خودی (رسول الله صلی الله علیه وسلم) تأكیدی لەخودی (هاوەڵان) كردووە ئایا ڕاسته یان نا؟ كاتێک ئەوان تعدیلیان كردووە ئینجا قبوڵی كردووە، هەروەها خودی (هاوەڵانی) بەڕێز كاتێک پێغەمبەر لەژیاندا بووە لەپەنهایی ئەودا شتێكیان لەهاوەڵێک دیتبێت یاخود بیستبێت ئایا ڕاستەوخۆ قبوڵیان كردووە؟ بڵێن تەواو ئەمە حدیثة! لەدوای وەفاتی رسول الله تەنانەت هاوەڵانی بەڕێز لەنێو خۆیان چۆن و بەچ ڕێگاو شێوازێک دینیان لەنێوان یەک

قبوڵ كردوه ئايا ڕاستەوخۆ ملكەچ بوون و تەواو بێ هیچ لێكۆڵینەوەو تدقیق تحقیقێک گووتویانە ڕاستە ئەوەی فلان دەڵێ تەواوە؟

دوای ئەوان (تابعین) چۆن دینیان لەهاوەڵان وەرگرتوە دوای ئەوان (اتباعي تابعين) چۆن دینیان لەتابعین وەرگرتوە.

لەهەر سەردەمێک لەوانەی کەباسم کرد بۆتان نمونەیەک یان دوو یان زیاتر دەهێنمەوە و (تحقیق و تعلیقی) لەسەر ئەدەین بێگومان نمونەی زۆر زیاترمان هەیە، وە ئەم حدیثانە یان ڕووداوانە باسکراون لەکتێبەکانی الجرح والتعديل و هەندێ سەرچاوەی تری وەک (العلل) کەوا لە المتقدمين و متأخرين باسكراون.

واتە: {تلبسوا الحق بالباطل} کەوا الله عز وجل داوای لە جولەکە کرد بەوەی حەق نەشارنەوە بەڵام ئەوان شاردیانەوە

وەك دەفەرموێت : {يعرفونه كما يعرفون أبناء هم} سبحان الله عز وجل بەم شێوە پڕ حیکمەت و ووردە نمونەیان لەسەر دەهێنێتەوە وەك چۆن کەسێک منداڵەکانی خۆی بناسێت ئەوانیش حەقیان ناسیوە بەڵام کتمیان کردووە واتە شاردوویانەتەوە وە دیوێکی جوانیان بەبەر باطل دا کردووە.

وه له حديثى صحيح كه البخاري و مسلم و ابي داود والترمذي و احمد لەمسند هێناویانه لەبارەیی:

(جوولەکەکان لەمەدینه کاتێک هاتنه لای پێغەمبەر بەوەی دووکەس لەوان زینای کردووه ، پێیانی فەرمووچی لێدەکەن ئەوانیش گوتیان ، ڕوویان بەشتێک ڕەش دەکەین و لەسەر پشتی گوێدرێژێک بەنێو خەڵک ئەیانسوڕێنین ، ئەمه لفظی ابی داوده وه لەڕیوایەتێکی تر کاتێ پرسیار له یەکێک لەزاناکانیان دەکات احبارێکی یهودی سوێندی دەدات بەوەی حددی زینا چیه لەتەورات؟ دەڵێت ئێمه کاتێک زیناو دوێن پیسی لەنێو گەورەکانمان واته (أشرافنا) زیادی کرد بۆیه کاتێک یەکێکیان بیکردایه سزامان لەسەر جێبەجێ نەدەکرد بەڵام هەژارەکانمان سزا ئەدا بۆیه بیرمان له وه کردەوه شتێکی وا دابنێین بگونجێ لەگەڵ هەردوولا).

واته ئەوان حەقیان کەبۆ هاتبوو کەتمیان کرد وه شوێن باطل کەوتن.

(ئەم نمونەم بۆ ئەوەبوو کەوا ئەوان حەقەکەیان دەناسی بەڵام تحریفیان دەکرد یحرفون الکلم عن مواضعه)، مەترسیەکه لەوەدایه کەوا رهبان و احبار و أئمەی ئەمڕۆ دینێکی نوێ بۆت دادەڕێژن تۆ هەستی پێناکەی.

بۆیه پێویسته موسڵمان شوێن هەنگاوی سەلەف و خیر القرون بکەوێت لەم باسەدا بەیارمەتی خوای تعالی گومڕا نابێت وه حەقی لێ ڕوون دەبێت ،وەباشترین سەلەفی ئێمه هاوەڵان و تابعین و اتباعی تابعینن.

### هەڵوێستی رسول الله صلى الله عليه وسلم چۆن بووە بەرامبەر بە هاوەڵان

نمونەیەك: لەسەر چۆنیەتی قبوڵی پێغەمبەر لەهەواڵ پێدانی هاوەڵان بۆی لە شتێک دا:

١: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ ، أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ أَبِي تَمِيمَةَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ مِنِ اثْنَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو الْيَدَيْنِ : أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ ؟ " فَقَالَ النَّاسُ : نَعَمْ. فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى اثْنَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ ثُمَّ رَفَعَ[٢].

واته: أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرموێت: رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەدوو ڕکعات نوێژدا هەستا واتە سەلامی داوە ، ذُو الْيَدَيْنِ پێی گووت، ئایا نوێژ کورت بۆتەوە یان بیرت چووە؟ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فەرمووی ئایا ذُو الْيَدَيْنِ ڕاست دەکات؟ خەڵکی گووتیان بەڵێ ، ئینجا رسول الله هەستاو دوو ڕکعاتی دوایی کرد

[٢] ئەم حدیثە صحیحە، اخرجه الأئمة (البخارى / ٤٨٢،٧١٤،٧١٥،١٢٢٧،١٢٢٩،٦٠٥١،٧٢٥٠) ومسلم/ ٥٧٣ و (ابو داود/ ١٠٠٨،١٠١٤،١٠١٥) والترمذي/ ٣٩٩، (والنسائي/ ١٢٢٤،١٢٢٥،١٢٢٧،١٢٢٨،١٢٢٩،١٢٣٠)

[وابن ماجة ،١٢١٤ ، موطا مالك ،٢٤٧،٢٤٨، والدارمي،١٥٣٧،١٥٣٨، و مسند احمد بن حنبل]، وە بەکۆمەڵێکی لفظ ی کورت و درێژ هاتوون ئەم لەفظەش البخاري هێناویەتی.

وەسەلامی داوە ئینجا تکبیری کرد وەسجدەی برد وەکو سجودی تر یان درێژتر ئینجا سەری بەرز کردەوە.

بێگوومان زۆرینەی ئەم فەرموودەو بەسەرهاتەی بیستووە ئەم باسە زۆرێک لەمحدثەکان لەکتوبەکانیان لەبابی الجرح والتعدیل هێناویانە وە لەکتوبەکانی معاصر لەپێشەکی زۆرینەیان موجودە.

لێرەدا بەزمانی حدیثی ڕاستەوخۆ رسول اللہ صلى اللہ علیه وسلم تصدیقی قسەی ئەم هاوەڵەی نەکرد کە خۆشی ناوی لێناوە (ذُو الْيَدَيْنِ) بۆیە هەتاوەکو خەڵکەکە واتە هاوەڵان تعدیل و توثیقی قسەکەیان نەکرد ئەویش دانی پێدا نەنا.

بەڵێ ڕووی لەهاوەڵانی کرد ئایا ڕاست دەکات؟

چونکە، لەنێو دەیان هاوەڵ کەوا ابوبکر و عمر ی تێدا بوو ئەوان لەشەرما هیچ ووتەیەکیان لەدەم نەهاتە دەر ، بۆیە کاتێکە خەڵکە دووپاتی قسەی ئەویان کرد واتە ذُو الْيَدَيْنِ. ئینجا هەستاو نوێژەکەی تەواو کرد.

٢: زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ رضي الله عنه دەفەرمووێ[٣] : من لەگەڵ مامم بووم گوێم لە (عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ ابْنَ سَلُولَ) بوو دەیگووت:

بەهاوەڵەکانی { لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا }،و {لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ}. ئەو هەواڵەم بە مامم گووت مامیشم بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ی گووت، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،بانگی کردم و منیش بۆم باسکرد دواتر پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ناردی بەشوێن (عبدالله بن أبي) و هاوەڵەکانی ، ئەوانیش سوێندیان خوارد کە شتی وایان نەگووتوە بۆیە رسول اللهصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بڕوای پێنەکردم ، بۆیە خەمباریەك دایگرتم کە هەرگیز شتی وام بەسەر نەهاتبێت ، لای ماڵ دانیشتم ومامم بانگی کردم و گووتی بەو شێوە دەتویست پێغەمبەر بەدرۆت بخاتەوە.

دواتر ئایەتی: {إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ} دابەزی و پێغەمبەر ناردی بەشوێنم دا و فەرمووی: الله عزوجل بەڕاستی دانایت.

لێرەدا: ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا پێغەمبەر چۆن مامەڵەی لەنێوان هاوەڵان کردووە ئەگەرچی (زید بن أرقم) هاوەڵێکی بەڕێزە بەڵام (ابن سلول) ئەگەر الله تعالی لەڕێگەی وەحیەوە پێغەمبەری ئاگەدار نەکردبا ئەوا نەیدەزانی کەوا منافقە، بۆیە بوڵکردن و بڕواکردن و تصدیقي قسەی هاوەڵێك لەسەر یەکێکی تر بێ ئەوەی لێبکۆڵێتەوە وەك ئەو باسەیەکەوا الله تعالی پێغەمبەر داودي علیه السلام پێ

---

[٣] البخاري ٤٩٠٠الترمذي ٣٣١٢والمسلم ٢٧٧٢وأحمد ١٩٢٨٥ واللفظ للترمذي

تاقیکردەوە کە ڕاستەخۆ حوکمی دا تەنها بەگوێگرتن لەلایەنێک و بڕواکردن پێی بێ ئەوەی قسەی بەرامبەر وەربگرێت ، ئەمەش تاقیکردنەوەی الله بوو بۆی دواتر تۆبەی لەسەر کرد و الله عزوجل لێی خۆش بوو.

لەبەر ئەوەشە هەڵوێستی پێغەمبەر لەگەڵ و لەنێوان هاوەڵانی زۆر حەکیمانەیە، کاتێک زید هەواڵی شتێکی وای پێدا ڕاستەوخۆ (جرح)ی عبدالله بن سلولي نەکرد تاوەکو بانگهێشتی کردن وە قسەی لێ وەرگرتن ، ئینجا کاتێک ئەوان سوێندیان خوارد (تعديل)ی ابن سلول ی کرد.

٣: عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ[٤] دەڵێت : گوێم لە ( عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بوو دەیگووت: گوێم لە (هشام حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ) بوو سورەتی الفرقانی دەخوێند بە جۆرێکی تر لەوەی کەوا من کوێم لێیببوو وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆی خوێند بووینەوە ، ویستم پەلەبکەم بۆ لای بەڵام خۆم گرت تاوەکوو تەواو بوو ئینجا چووم بەجلەکەیەوە گرتم بردم بۆلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێم گووت:

ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ من گوێم لەوە بوو کەوا قورئانی دەخوێند پێچەوانەی ئەوەی تۆ بۆت خوێندووینەوە!

[٤] ( مسلم١٠ ، والبخاري٦٣ وأبو داود ٤٨٦ والنسائي ٤٥٩وأحمد١٢٤٥٧ والترمذي ٦١٩والدارمي ٦٧٦وابن ماجة١٤٠٢ )

پێی فەرموو: واتە بە (حكيم بن حزام) بۆم بخوێنەوە ئەویش بۆی خوێندەوە فەرمووی بەو شێوە دابەزیوە ،ئینجا پێی گووتم بخوێنەوە ، منیش خوێندمەوە فەرمووی: بەو شێوە دابەزیوە، ئینجا فەرمووی قورئان دابەزیوە لەسەر حەوت پیت بیخوێنەوە بەوەی کە ئاسانە.

دەڵێم : هەریەك لە (عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) و (هشام بن حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ) دوو هاوەڵ بوون، ئەوەی کە گرنگە تیشکی بخەینە سەر لەسەردەمی پێغەمبەر بووە صلى الله عليه وسلم.

ئیمامی عمر شتێکی نوێی لەدین گوێ لێ دەبێت کەوا پێشووتر گوێی لێ نەبووە ، لێرەدا باسەکە چوارچێوەیەکی زانستی (الجرح والتعديل)ی بەبەردا بکەین بەو شێوەیە ئیمامی عمر جرحی هشامی کردووە.

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کاتێک ئەو باسە دەچێتە لای ڕاستەوخۆ نە جرح نە تعديل ی هیچ یەکێکیان ناکات تائەو کاتەی گوێی لە هەردوو لادەبێت، ئینجا بڕیار دەدات، کاتێک( تعديل) ی هشام ی کرد عمر قبوڵی کرد.

٤: أنس بن مالك رضي الله عنه دەفەرموێت: نهی مان لێکرابوو لە قورئاندا کەوا پرسیار لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکەین، حەزمان دەکرد پیاوێکی دەشتەکی ژیر بێت و پرسیار بکات لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، پیاوێکی خەڵکی گوند هات بۆلای پێغەمبەر وە پێی گووت: ئەی محمد نێردراوەکەی تۆ هاتووە بۆ لامان، پێمان دەڵێت:

کەتۆ لەلایەن الله عز وجل نێردراوی، پێغەمبەر فەرمووی (ڕاست دەكات)، ئینجا گووتی:

- ❖ کێ ئاسمانی درووست کردووە ؟ فەرمووی : الله
- ❖ کێ زەوی درووست کردووە ؟ فەرمووی : الله
- ❖ کێ چیاکانی لەسەر داناوە ؟ فەرمووی : الله
- ❖ وە ئەوەی کە تێیدا دا هەیە ؟ فەرمووی :الله

گووتی : سوێند بەوەی ئاسمان و زەوی درووست کردووەوچیاکانی داناوە و بەوەی کە تێیدا هەیە ئایا الله تۆی ناردووە ؟ فەرمووی بەڵێ ، وە نێر دراوەکەت دەڵێ پێنج نوێژ لەشەو و ڕۆژێکدا فەرزکراوە لەسەر مان ئایا ڕاستە ؟

فەرمووی : بەڵێ ، گووتی سوێند بەوەی پێی نێردراوی یان بە الله ، الله فەرمانی پێکردوی؟ فەرمووی : بەڵێ.

وە نێردراوەکەت پێی وایە کەوا ڕۆژووی ڕەمەزان لەساڵێکدا فەرزە لەسەرمان؟ فەرمووی بەڵێ ڕاستە گووتی سوێند بەوەی پێی نێردراوی یان الله ، الله فەرمانی پێکردووی ؟ فەرمووی بەڵێ.

ئینجا گووتی: نێردراوەکەت دەڵێ زەکاتی ماڵمان لەسەرە؟ فەرمووی: ڕاستە.

گووتی سوێند بەوەی پێی نێردراوی الله فەرمانی پێکردووی؟ فەرمووی بەڵێ.

گووتی وه دەڵێ حەجی ماڵی خوامان لەسەرە ئەگەر توانامان هەبوو؟ فەرمووی: بەڵێ ڕاستە.

گووتی بە الله یان سوێند بەوەی پێی نێردراوی الله فەرمانی پێکردووی ؟ فەرمووی: بەڵێ.

دەڵێم: لەو فەرموودەیەدا یەکێ لەهاوەڵان کەوا هەواڵی داوە بەکەسێک لەبارەی ئیسلام ، بەڵام ، ئەو جگە لەوەی لە جەهالەتدا بووە پێش ئیسلادا بەڵام ، هاتووە تاوەکو دڵنیابێت لەو شتە و لێی بکۆڵتەوە ئایا ڕاستە یان نا ، بۆیە پێویستە موسڵمان لەمرۆدا ساویلکە نەبێت و وورد بێت لەو شتانەی گوێی لێدەبێت لەسەر دینەکەی ئینجا لەهەر کەسێک بێت ، چونکە ئەو لایەنە ، لە پاکترین سەردەمەکان ، کاری پێکراوە وبەرامبەر بە چاکترینەکان ، فکیف بۆ ئێستا !

٥: عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُود ئەویش لە أَبِي هُرَيْرَةَ وَ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ دەڵێن: دوو پیاو ناکۆکیان بردە لای رسول الله صلى الله عليه وسلم، یەکێکیان گووتی: ئەی پێغەمبەری وا دادوەری بکە لەنێوانمان بە (کتابی الله) ئەویتریان کە تێگەیشتووتربوو گووتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا دادوەری بکەلەنێوانمان بە کتابی الله وە ڕێگەشم پێبدە کەوا قسەم بکەم، فەرمووی: قسەبکە، ئەویش گووتی: کوڕەکەی من شوانە لای ئەو کابرایە، زینای لەگەڵ ژنەکەی کردووە، پێیان گووتووم کەوا لەسەر

کوڕەکەی من ڕەجم کردنە، منیش فدیەم داوە بە ١٠٠ مەڕ وە لەگەڵ کچێک ، ئینجا دواتر من پرسیارم لە ئەهلی علم کرد، هەواڵیان پێدام ، کەوا لەسەر کوڕەکەم ١٠٠ جەڵد و دوورخستنەوەی ساڵێکە ، وە لەسەر ئافرەتەکەش ڕەجم کردنە.

رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە دادوەری دەکەم لەنێوانتان بە کتابی الله، سەبارەت بە مەڕو کچەکە ئەوا دەگەڕێتەوە بۆت، وە ١٠٠ جەڵد لەکوڕەکەت دەدرێ و لەگەڵ ساڵێک دوورخستنەوە، وە فەرمانی بە (أنيس الأسلمي) کرد بچێتە لای ئافرەتەکەی تر، گەردانی پێدا نا ئەوا ڕەجمی بکات ، ئەوەبوو دانی پێدا ناو ڕەجم کرا.[٥]

**دەڵێم:** ئەو باسە لەسەردەم و ساتی ژیانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕوویداوە ، واتە لەنێوان هاوەڵاندا. ئەوکەسەی کەوا کوڕەکەی زینای کردووە ، پێیان گووتوە کوڕەکەی ڕەجمی لەسەرە ، بەڵام ئەو هەستاوە پرسیاری لە (ئەهلی علم) کردووە لەو بارەوە ئەوانیش وەڵامیان بەو شێوە دایتەوە کەوا کوڕەکەی تەنها جەڵدی لەسەرە لەگەڵ دوورخستنەوە ، بەڵکو ڕەجم لەسەر ئافرەتەکەیە ، بۆیە دەچێتە لای پێغەمبەر، ئەویش بەهەمان شێوە حوکم دەدات وە سەد مەڕو ئافرەتەکەی بۆ دەگەڕێنتەوە.

---

[٥] (البخاري ٢٧٢٤ ومسلم ١٦٩٧ و أبوداود ٤٤٤٥ و الترمذي ١٤٣٣ و النسائي ٥٤١٠ و الدارمي ٢٣٥٣و احمد ١٧٠٣٨ و مالك ٢٣٧٩)

ئەوەی گرنگە ترکیزی لەسەر بکەن، ئەو کەسە ئیمامی أبو هریرە دەڵێت: ( وَهُوَ أَفْقَهُهُمَا ) واتە زۆر لەویتر تێگەیشتوو تر بوو.

بەڵێ ، سەیرکەن چونکە تێگەیشتوو دانا بوو، ڕۆیشتوە پرسیاری لە ئەهلی علم کردیە واتە کەسانی شارەزا دواتر بۆ دڵنیابوون دەچێتەوە لای پێغەمبەر، فسبحان الله لە (خیر القرون) و إنا لله بۆ شر القرن کە ئەمڕۆیە ، تۆی موسڵمان پێویستە لەهەموو لایەن و باسێکی دین قدوەت خیر القرون بێت ، وەک دەبینین ، ئەوان چۆن و بەچ شێوەیەک مامەڵەی لەگەڵ باس وبابەتە دینیەکان کردووتەوە ، زۆر وورد بوون، زۆر بەهەست بوون، زۆر پێداگر بوون، تاوەکو دڵنیانەبووبن و زیاتر لە لایەنێک پرسیان نەکردبێت، قبوڵیان نەکردیە.

گوومان لە ڕاستگۆیی هاوەڵان بەگشتی نیە و نەبووە ، بەڵام ئەوە دینە.

## هەڵوێست و مامەڵەی هاوەڵان

چەند نمونەیەك كە هەڵوێستی هاوەڵان لەنێوان خۆیاندا دەردەخات لەسەر فەرمووده و باسێكی نوێ لەدیندا كەپێشتر گوێیان لێنەبووبێت.

١: **عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَرضي الله عنهما** دەفەرموێت : **له سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ** ئەویش لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كەوا مسح ى لەسەر( گۆرەوییەكان دەكرد یان نەعل یان ئەوشتەی كە لەپێی دا بووە ئەوكات ) وە عبدالله بن عمر پرسیاری ئەو شتەی لە عمر رضي الله عنه كرد ؟ فەرمووی : بەڵێ ، وەپێی فەرموو : ئەگەر سعد شتێكی لە پێغەمبەرەوە بۆ باسكردی ئەوا پرسیار لە هیچ كەسێكی تر مەكە دەربارەی.

**قال الكردي:**

ئەم باسە وا گوومان دەبرێت دوای وەفاتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بێت ، واتە هەڵوێستی هاوەڵان لەنێوان یەك لەسەر ئەو حدیثانەی كەوا لەیەك گوێیان لێدەبێت ، ابن عمر شتێكی نوێی لە یەكێك لە هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر كەوا سعدە گوێ لێ دەبێت (سعد) یەكێكە لە دە موژدە پێدراوەكان وە یەكەم تیر كە لەئیسلام كراوە ئەو بووە.

ابن عمر بۆ تأكید كردن لەو باسە پرسیار لەباوكی دەكات كەوا، ئیمامی(عمر)ە یەكێكە لەدوەم باشترین بەندە لەدوای پێغەمبەران ، ئیمامی(عمر) ڕاستەوخۆ(تعدیل) وە (تصدیق) ی هاوەڵی بەڕێز سعد دەكات ، وەجارێكی تریش دووپاتی دەكاتەوە پێی

دەفەرمووێت : ئەگەر سعد شتێکی بۆ باسکردی بەهیچ شێوەیەك پێویست بەوە ناکات پرسیار لەکەسی تر بکەیتەوە ) ئەمە ئەو پەری بە ڕاستگۆ دانانە.

کەواتە ئەگەر هاوەڵان لەنێوان خۆیان بەو شێوە مامەڵەیان کردبێت لەسەر دین فکیف بۆ ئێمە کە زۆر زیاتر پێویست ترە.

٢: عَبْدُ الْجَبَّارِ بْنُ الْوَرْدِ دەڵێت[٦]: گوێم لە **ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ** بوو دەیگووت : کاتێک(أُمُّ أَبَانٍ) وەفاتی کرد منیش ئامادەبووم لەگەڵ خەڵکدا ،لەنێو هەریەك لە عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ وَابْنِ عَبَّاسٍ دانیشتبووم، ئافرەتەکان گریان، ابن عمر فەرمووی: ئایا ئەوانە بێدەنگ ناکەن لەگریاندا، چونکە من گوێم لەرَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو دەیفەرموو: مردوو لەنێو گۆڕدا ئازار دەدرێت بەهۆی گریانی کەس و کارەکەی لەسەریدا.

ابن عباس فەرمووی: ئەوە(عمر)یش شتێکی لەوەی دەگووت، دەڵێ: دەرچووم لەگەڵ عمردا تاوەکو گەیشتینە لای (البيداء) کاروانێکی بینی لەژێر دارێک بوون، عمر فەرمووی بڕۆن بزانن کێیە ئەوە؟ چووم بینیم (صُهَيْبٌ)و کەس کاری بوون، عمر فەرمووی: صُهَيْبٌ م بۆ بێنن ، وەکاتێک گەیشتینەوە مەدینە عمر پێکرا واتە بریندار کرا.

[٦] ( البخاري١٢٨٦ / ١٢٩٠ والمسلم ٩٢٧ ٩٢٨,٩٣٠, ، والنسائي ١٨٥٨ والترمذي ١٠٠٢/ ١٠٠٤ وأبو داود ٣١٢٩وابن ماجة ١٥٩٣وأحمد٢٤٧/٢٤٨ واللفظ للنسائي )

صُهَيْبٌ دەستی کردە گریان لەسەر عمر دا و دیفەرموو: (وای براکەم وای براکەم) عمر بە صُهَيْبٌ ی گووت مەگری، چونکە من گوێم لە رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو دەیفەرموو: مردوو ئازار دەدرێت بەهۆی گریانی کەس و کاری لەسەری دا، (ابن عباس دەڵێت: ئەوەم بە (عائشة) گووت، فەرمووی: سوێند بە خوا ئەو باسە لە کەسانێکی درۆزن دەرنەچووە واتە (عمر ،ابن عمر) بەڵام بەهەڵە گوێیان لێیبووە، بۆ ئەوەش قورئان چارەسەرە بۆتان کە الله عزوجل دەفەرموێت: {أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى} وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: الله تعالی سزای کافر و بێباوەڕان زیاتر دەکات بەهۆی گریانی کەس و کارەکەی لەسەری.

**قال الكردي:**

ئەوەی سەرەوە چۆنیەتی مامەڵەی هاوەڵانە لەگەڵ یەک لەنێویان دا هەریەک لە ئیمامی عمر و ابن عمر و ابن عباس و عائشة یە ، لێرەدا هاوەڵی بەرێز ابن عباس ئەو هەواڵەی بە عائشة گەیاند ئەمەش نەک بۆ ئەوەبوو بێتن سیقەو متمانەی بە و هاوەڵانە نەبێ نەخێر بەڵکو بۆ دڵنیابوون لەو باسە وەک دەبینرێ عائشە ڕایەکی جیاواز لەوانی هەیە و نزیکترە لە صواب والله اعلی واعلم.

٣: أَسْمَاءَ بْنِ الْحَكَمِ الْفَزَارِيِّ دەڵێت[٧] : گوێم لە علي رضي الله عنه بوو دەیفەرموو : من کەسێکم ئەگەر گوێم لە فەرموودەیەك بوایە لەرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە ئەوا سوودم لێوەردەگرت ڕاستەوخۆ تائەوەی الله ویستی لەسەر بوایە، وە ئەگەر یەکێک لەهاوەڵانم فەرموودەیەکیان بۆ باسکردبایەم ئەوا (سوێندم ) دەدان ئینجا ،وەکاتێک سوێندیان خواردبایە ئەو کات بڕوام پێدەکردن ،وە أبو بكر بۆی باس کردم وەڕاست دەکات ئەبو بکر ... الخ الحديث.

**قال الكردي:**

لەڕووی سەنەدەوە مەداری ئەو فەرموودە هەتا (أَسْمَاءَ بْنِ الْحَكَمِ الْفَزَارِيِّ) کەوا ( فيه مقال)، لە زانایانی المتقدمين وەك:

- يحيى بن معين دەڵێ : نەناسراوە
- و البخاري دەڵێت : لايتابع و البزار دەڵێت : مجهول
- و العجلي و الذهبي وابن حبان وابن حجر توثیقیان کرد
- لە کتوبەکانی الجرح والتعديل وعلم الرجال ئەم فەرموودە زۆر ئاماژەی پێکراوە
والله سبحانەوتعالى أعلم.

---

[٧] ( أبو داود ١٥٢١ والترمذي ٤٠٦ ,٣٠٠٦,وابن ماجه ١٣٩٥وأحمد ٥٦،٢/٤٧)

### شیکردنەوە

ئەگەر لێی وردبینەوە چەند خاڵێکی گرنگمان بۆ دەرەکەوێ

لەوانە ئیمام علي دەفەرموێ : کاتێک گوێم لە پێغەمبەر دەبوو ڕاستەوخۆ سوودمەند دەبووم چونکە هیچ شەك و گومانێك هەڵناگرێت.

وە خاڵێکی تر ئەوەیە ووردبوون لەوەی کە گوێی لێدەبێت بەجۆرێك سوێندی داون وەدەڵێ تا سوێندیان نەخواردبێ لێم وەرنەگرتوون ، ئەمە تعبیرە لەوەی دین زۆر هەستیار ترە لەوەی هەر شتێکت گوێ لێبێت و تەواو بیکەیتە دین و بڕوای پێبکەیت ، ئەی( تبین).

٤: قال **أبوداود** بۆی باسکردین أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ ،هەواڵی پێداین **سُفْيَانُ** ، **له يَزِيدَ بْنِ خُصَيْفَةَ** ، له **بُسْرِبْنِ سَعِيدٍ** ، ئەویش له **أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ** گووتی[٨]:

ئێمە دانیشتبووین لە یەکێکە لە مەجلیسەکانی ( أنصار) لەوکاتەدا أَبُو مُوسَى هات بە پەشۆکاوی، پێمان گووت: چ شتێک وای لێکردوی؟ فەرمووی: عمر فەرمانی کرد کەوا بچم بۆلای، منیش چووم داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەم کرد بۆ لای سێ جار بەڵام مۆڵەتی نەدا، منیش گەڕامەوە، دواتر ناردی بەشوێنم دا و فەرمووی: چ شتێک ڕێگر

---

[٨] البخاري ٢٠٦٢ ، ٧٣٥٣ومسلم ٢١٥٣ , ٢١٥٤وأبي داود ,٥١٨٠، ٥١٨١ والترمذي ٢٦٩٠ وابن ماجه ٣٧٠٦ومالك ٢٧٦٦ ، ٢٧٦٨والدارمي ٢٦٧١ وأحمد ١١٠٢٩)

بوو لەوەی بێیت بۆلام؟ منیش گووتم : هاتم بۆلات وە سێ جار دوای مۆڵەتم لێکردی بەڵام مۆڵەتت نەدا، وە رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێکتان داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی کرد سێ جار ڕێگەیان پێنەدا ئەوا با بگەڕێتەوە) عمر فەرمووی : دەبێت لەسەر ئەو شتە بەڵگەم بۆ بهێنیت، أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ فەرمووی: هیچ کەسێکمان لەگەڵت نایەت ئیللا بچوکترینیان نەبێت، ئینجا أبو سعید لەگەڵی ڕۆیشت و شاهێدی بۆی دا.

وە لە دوو ریوایەتی تر دا وردەکاری زیاتری تێدایە

أبو داود دەڵێت: بۆی باسکردین زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ ، بۆی باسکردین عَبْدُ الْقَاهِرِ بْنُ شُعَيْبٍ، بۆی باسکردین هِشَامٌ ، له حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ ، له أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى ، ئەویش لەباوکیەوە: بەهەمان بەسەرهات ، ئینجا عمر بە أبو موسى ی فەرموو: من تۆمەتبارت ناکەم بەدرۆ بەڵام فەرموودە لە رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گرانە.

أبو داود دەڵێت: بۆی باسکردین عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ ، له مَالِكٍ ، له رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ،وە زیاتر لەچەند کەسێک لە زانایان لەسەر ئەوە : عمر بە أبو موسى فەرموو : من تۆمەتبارت ناکەم بەڵام ترسم لەوەیە خەڵك شت بڵێن لەسەر رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.[٩]

---

[٩] (أبو داود ، ٥١٨٤ ، سەنەدی : رجالەکانی ثقة ن تەنیا ئەوە نەبێت رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ له أبو موسى مرسل چونکە گوێی لێ نەبووە نەگەیشتووە بەو سەردەمە والله اعلى وأعلم)

وە لەڕیوایەتی صحيح البخاري ٢٠٦٢ ، ٧٣٥٣ , أبيَّ بن كعب بە عمر دەڵێت : ئەی عمر مەبە هۆی ئازار بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ، ئیمامی عمر دەفەرموێ : نابمە ئازار بۆیان.

**قال الكردي:**

باسەکە تایبەتە بە مۆڵەت وەرگرتن لە کاتی سەردانی کردندا ، بەڵام ئەوەی هەیە وگرنکە و باسی ئێمەیە ئەوەیە

ئیمامی(عمر)(رضي الله عنه) ڕاستەو خۆ قبوڵی ئەوەی نەکرد کەوا ئەبو موسی بۆی باسکرد ، بەڵکو پێداگر بوو لەوەی دەبێت بەڵگەی بۆ بهێنێت ، بەڵگەش ئەوەیە کەوا کەسانی تر ببنە شاهێد لەسەر ئەو باسە ، واتە مەرجە ئەو کەسەی دەبێتە شاهێد لەسەر باسێکی شەرع و فەرمودە کەسێکی عەقیدە پاك ، ڕاستگۆ ، تەقوادار بێت.

بەڵێ بێگومان ئیمامی عمر لە زۆر شوێنی تر لەو باسانە پێداگر بووە.

لە دوو ریوایەتی دواتر ، خۆی ڕوونی دەکاتەوە کەوا ترسی لەوەیە ئەگەر بێت و بەو شێوە هەریەك بێت و قسەیەك بکات ، بڕوای پێبکرێت بەمەش دەرگا بەڕووی دڵ نەخۆش و کەسانی درۆزن دەڕەخسێت چیان بوێت ومەبەستیان بێت بە ناوی رسول الله وە بیلێن.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، لەنێو چاکترین و پاکترین وڕاستگۆترین چینی سەر زەوی و ئیسلامدا کە هاوەڵانن داوای بەڵگەو شاهێدی کراوە فکیف بۆ ئێستا کە ( شر القرنە).

٥: السَّائِب بْن يَزِيد باسيدەكات و دەڵێت: گوێی لە سُفْيَان بْنَ أَبِي زُهَيْر دەبێت كەوا پیاوێكە لە (أَزْدِ شَنُوءَةَ) وە یەكێكە لە هاوەڵانی رسول الله صلی الله علیه وسلم گووتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو : هەریەك سەگێک ڕابگرێت بۆ جگە لە كشتوكاڵ و مەڕوماڵات، ئەوا هەموو ڕۆژ لە كردەوەكانی بە ئەندازەی یەك قیراط كەمدەبێتەوە، منیش پێم گووت: تۆ خۆت ئەوەت لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بیستووە ؟ فەرمووی : بەڵێ وَرَبِّ هَذَا الْمَسْجِد.[١٠]

**دەڵێم:** السائب بن یزید: یەكێكە لەهاوەڵان وە هەروەها سفیان بن أبي زهیر ، بەهەمان شێوە صحابیة ، واتە هەردوو لا هاوەڵ بوون ، بەڵام ، (السائب ) تأكید و دڵنیایی دەكاتەوە لە سفیان ، پێی دەڵێت تۆ خۆت ئەوەت بیستووە لە پێغەمبەر ؟ سوێندی بۆ دەخوات.

بەڵێ، خوێنەری بەڕێز و موسڵمانی خۆشەویست ، ئەو دینە وەك سەلەف دەڵێن: گۆشت و خوێنتە ، وا بینیتان و خوێندتانەوە ، سەلەفی ئێمە و خیر القرون ، باشترین سەدەكانی هەموو ئوممەت ، چۆن بوونە و بەچ شێوەیەك لەگەڵ یەک مامەڵەیان كردووە لە باسی دیندا .

---

[١٠] (موطأ مالك ٢٧٧٧ و البخاري ٢٣٢٣/ و النسائي ٤٢٨٥ ابن ماجه ٣٢٠٦ و الدارمي ٢٠٤٨ و أحمد٢١٩١٣)

٦: ئیمامی مالك هێناویەتی لە یحیی بن سعید ئەویش لە سلیمان بن یسار دەڵێت: هەریەك لە عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ،ناكۆكیان كەوتە نێوان لەسەر ئەو ئافرەتەی كەوا منداڵی دەبێت دوای وەفاتی مێردەكەی بەچەند شەوێك، (ئەبو سەلەمە) گووتی: هەركات ئەوەی ناوسكی دانا ئەوا تەواو دەبێت (واتە عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو) وە ابن عباس گووتی : بەڵكو ئەوەی بۆی دانراوە كە كۆتا ماوەیە , ئینجا (ئەبو هورەیرە) هات و گووتی من لەگەڵ ڕەئی براكەم دام واتە (أبو سلمة) ئینجا ( أبو كريب ) خادمی ابن عباس یان نارد بۆ لای [أم سلمة ]ی خێزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ، تاوەكو پرسیاری لەو بارەوە لێ بكات ، ئەویش هەواڵی ئەوەی پێدان كەوا (سُبَيْعَةُ الْأَسْلَمِيَّةُ) دوای وەفاتی مێردەكەی بەچەند شەوێک منداڵی دەبێت، ئەو هەواڵە دەدەن بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ، ئەویش دەفەرمووێت: تەواو لێرەوە ئازادە كێ بوێ دەتوانێ شوبكات.[١١]

دەڵێم: ئەگەر دیقەت بدەین دەبینین ئەو باسە لەنێوان هاوەڵان ڕوویداوە واتە پاكترین سەردەم ، لەسەر باسێک دوو لایەن ناكۆک دەبن ، تاوەكو هەواڵ نەدەن بە (ئوم سەلەمە ) ئەوا هیچ لایەك نە تصدیق نە تعدیلی ئەویتر ناكات ، گەرچی هاوەڵی بەڕێز ئەبو هورەیرە ڕاستەوخۆ تصدیقي قەولی ئەبو سەلەمەی كرد ، چونكە بینی قسەكەی صواب و نزیكە لەحەق، دواتر یش هەر بەو شێوە دەرچوو ، بۆیە ناكرێت ئێمەی داماو

[١١] (موطأ مالك ١٧٢٨ و آحمد ٢٦٤٧١ و الدارمي ٢٣٢٥/٢٣٢٦ والبخاري ٤٩٠٩ ومسلم ١٤٨٥ والترمذي١١٩٤ و النسائي ٣٥٠٩ هەتا ٣٥١٧)

جاهل لە سەردەمی پڕ فتنەی ئەمڕۆ هەرکێ قسەی کرد شاهێدی بۆ بدەین یان بڵێین ڕاستە تاوەکو دڵنیا دەبن ، ئەویش بە پرسین و پرسیار کردن لە ئەهلی علم و ثقة وەك چۆن خير القرون بەو شێوەيان كردووە.

٧: قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْب دەڵێت: داپیرەیەك هات بۆلای ئەبو بەکر، پرسیاری بەشە میراتی دەکرد، ئیمامی ئەبوبەکر پێی فەرموو: هیچ شتێک نەهاتووە لەبارەی تۆوە لە قورئان وە لە سونەتی رسول الله صلى الله عليه وسلم یش نەمزانیوە ، بگەڕێوە تاوەکو پرسیارت بۆ دەکەم لەخەڵك، ئینجا پرسیاری کرد لەخەڵک و ( موغیرەی کوڕی شوعبە ) هەستاو فەرمووی : من ئامادەبووم لای پێغەمبەر ، شەش یەکی پێدا ، ئەبوبەکر پێی فەرموو: ئایا کەسی ترت لەگەڵە تاببێتە شاهێد ؟ ئینجا محمد مسلمة هەڵستاو فەرمووی: هەروەک چۆن موغیرە باسی لێوەکرد، ئینجا ئەبوبەکر داواکاریەکەی جێبەجێ کرد ... الخ[١٢]

---

[١٢] (موطأ مالك ١٤٦١ وأبو داود ٢٨٩٤ والترمذي ٢١٠٠ وابن ماجه ٢٧٢٤ والدارمي ٢٩٨١ واحمد ١٧٩٨٠ واللفظ لمالك)

**قال الكردي:**

رجالەکانی هەموو ثقةن، ابن شهاب الزهري : یەکێکە لە ئیمام و پێشەواکانی ئوممەت.

عُثْمَان بْن إِسْحَاقَ بْن خَرَشَة : یەکێکە لە تابعين وە ابن معين بە ثقةی داناوە وە ئیمامی مالك بەهەمان شێوە.

قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْب: یەکێکە لە گەورە تابعين لە ساڵی ٨ یان ١٠ هـ لەدایك بووە وە لە ساڵی ٨٦ هـ وەفاتی کردووە ، ئیمام و ثقة بووە جگە لەوە ، سەلەف متفق بوونە لە سەر فقیهی و ئیمامەتی بەجۆرێک بەیەکێک لە چوار فەقیهەکەی مەدینە دادەنرێت.

بەڵام ڕیوایەتی لە [أبو بكر] فيه مقال، چونکە گوێی لێنەبووە.

وە ئیمامی الترمذي لە سنن دا دەڵێت: وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُيَيْنَةَ.

لێرەدا ئیمامی الترمذي ئەو ڕیوایەتەی هەڵبژاردووە بەسەر ڕیوایەتی (سفيان بن عيينة ) وە تصحيح ی ئەو ریوایەتەی بەسەر ریوایەتی ابن عيينه دا کردووە ، چونکە لەریوایەتی ابن عيينة مجهول ی تێدایە بەڵام ئەوەیان وەك باسمان کرد ، هەموویان ئیمام و ثقةن تەنیا (سماع ی قبيصة لە أبو بكر فيه مقال).

**دەڵێم:**

ئەوەی دەیبینن ، لەنێوان هاوەڵان دا بووە دوای وەفاتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، لەبارەی باسێکی دینە کەوا ئاڕاستەی یەکێک لە گەورەترین و بەڕێزترین پێشەواکانی ئوممەت کراوە ، ئەویش أبو بکرە ، بەڵام دەڵێت : هیچم لەو بارەوە نەبیستوە ، بۆیە بەدوای بەڵگە دەگەڕێت ، کاتێک یەکێک لە هاوەڵان کە (المغیرة) یە دەڵێت من بەڵگەم پێیە ، ئیمامی ئەبو بکر ڕاستەو خۆ ( تصدیق ) ی ناکات ، داوای شاهێدی لێدەکات ، ئینجا کە شاهێدی هێنا قبوڵی کرد، وە (توثیق و تعدیل) ی هەردوو لای کرد.

.

## هەڵوێست و مامەڵەی التابعين لەگەڵ هاوەڵان:

چەند نمونەيەك لە التابعين بۆ دەرخستنی چۆنيەتی مامەڵە كردنيان لەگەڵ هاوەڵان سەبارەت بەو فەرموودەو باسانەی كە لەيەكێك لەهاوەڵان بيستويانە:

١: وَهْبُ بْنُ كَيْسَانَ دەڵێت[١٣]: وا ڕێكەوت هەردوو جەژنەكە لەيەك ڕۆژ بن لەسەردەمی (عبدالله بن الزبير ) واتە (جمعةو جەژن)درەنگ هاتەدەرەوە تاوەكو ڕۆژ بەرز بۆوە ، دواتر دەرچوو وە ووتاری دا ووتارێكی درێژ دواتر دابەزی و نوێژی كرد وە ئەو ڕۆژە نوێژی هەينی بۆ خەڵكەكە نەكرد ، ئەو هەواڵە بە (عبدالله بن عباس ) گەياندراو و ئەويش فەرمووی:لەسەر سوننەت بووە.

**قال الكردي:**

واتە دوای وەفاتی پێغەمبەر ، لێرەدا تابعين وەك چۆن هاوەڵان لەكاتی بيستن يان بينين يان ڕوودانی شتێك لەيەكێك لە هاوەڵان ئەوا لەلايەنی ترەوە تأكيديان لەسەر كردۆتەوە ، عبدالله بن الزبير يەكێكە هاوەڵە بچووكەكان كەوا لە سەرەتايی كۆچ بۆ مەدينە لەدايك بووە ، لەزيرەكی دا دوای گەورە هاوەڵان زانايان بە هاوشێوەی ابن عباس و ابن عمری دادەنێن وە دانراوە بە (العبادلة) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاوەكو تعديل و توثيقي كەسێكی تری لەگەڵ نەبووايە ڕاستەوخۆ قبوڵ نەكراوە.

[١٣] ( النسائي ١٥٩٢ وأبو داود ١٠٧١وابن ماجة ١٣١١)

**خاڵێك ئاماژە پێدەدەم:**

کە دەڵێین تعدیل یان توثیق بەهیچ شێوەیەك ، جرح هاوەڵان ناگرێتەوە واتە لەو باسانەی کە هێناومەتەوە هیچ جۆرە جەرحێك لەسەر هاوەڵ جێ بەجێ نابێت چونکە ئەوان بە ئیجماع (عدولن وە ثقة) ن ئەوەی هەیە لەسەریان کاتێک قسەیان لەشتێک کردبێت یەکێکیان ئەویتریان گووتوویەتی نەیپێکاوە یان بەهەڵەدا چووە ، چونکە جرح بۆکەسێکە کە مقبول نەبێت وە ثقة نەبێت ، هەروەها خوودی(الجرح) کاتێک جێ بەجێ دەبێت لەسەر ئیمامێک یان راویەك ئەوا مانایی ئەوە نادات ئەو کەسە تەواو هیچ شتێکی لێ وەرناگیرێت چونکە ئیمام هەبووە لەشتێک دا مجروح بووە وەك تدلیس بۆنمونە چەندان زاناو ئیمامی وەک (الحسن البصري و الثوري و الأعمش و زۆرێکی تر دەگرێتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە ئیمام و پێشەوا بووینە وە دانراون بە پلە نزیکەکانی زانست لە زۆرینەی بوارەکان ، والله أعلم.

٢: أَبِي عَطِيَّةَ دەڵێت : بە عائشة م گووت دوو لەهاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەنێوماندان ، یەکێکیان پەلە دەکات لە ڕۆژ وو شکاندن وە پارشێویش درەنگ یان تاخیر ، وەیەکێکی تریان ، ڕۆژوو شکاندن تأخیر دەکات وە پەلە لە پارشێو دەکات،

فەرمووی: کامیان ڕۆژووەکەی زووتر دەشکێنێت و پارشێو تاخیر دەکاتن؟ گووتم: (عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ) فەرمووی: پێغەمبەر بەو شێوەی دەکرد .[١٤]

وە لەریوایەتێکی تر

أَبِي عَطِيَّةَ دەڵێت : من و مسروق ڕۆیشتین بۆلای عائشة مسروق پێی گووت : ئەی دایکی ئیمانداران دوو پیاو لەهاوەڵانی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ یەکێکیان، پەلەدەکات لە ڕۆژوو شکاندن وە پەلە دەکات لەنوێژ کردن، یەکێکی تریان ڕۆژوو شکاندن تأخیر دەکات وە نوێژیش بەهەمان شێوە ، فەرمووی : کامیان پەلە دەکات لە ڕۆژوو شکاندن و نوێژ کردن؟ گووتمان عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُود. فەرمووی : پێغەمبەر بەو شێوەی دەکرد. وە ئەویتریان أَبُو مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا[١٥] .

دەڵێم : أبو عطية (٧٠ھ) و مسروق دوو گەورە تابعینن لە ئوممەت وە ئیمام و ثقة ن لەوکاتدا واتە لەیەکێک لەباشترین و چاکترین سەدەکانی مێژووی ئیسلام و ئوممەت کە دوای وەفاتی پێغەمبەر بەو شێوە (دەپرسن وە لێدەکۆڵنەوە) واتە چوون بۆلای دایکی ئیمانداران چونکە ئەو دوو هاوەڵە کە یەکێکن لە هاوەڵە پلە بەرزەکانی ئوممەت ئەوانیش: (عبد الله وأبو موسى) اختلافیان لەو حاڵە هەبوو واتە لە و کردەوە ئەوەی ئەو تابعیانە بینیویانە، دایکی ئیمانداران یەکێکە لە ئوممەهاتی ئیمانداران پلە و پایەی لێردە بەدوو دێر باسناکرێت، بەڵام (تعدیل) ی( عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ ) دەکات چونکە بە هەمان شێوەی پێغەمبەری کردووە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

---

[١٤] (مسلم ١٠٩٩ ، وأبو داود ٢٣٥٤و النسائي ٢١٥٩/ ٢١٦٠/ ٢١٦٢ وأحمد٢٤٢١٢ والترمذي ٧٠٢)

٣: **النسائي** دەڵێت :هەواڵی پێدام **مُحَمَّدُ بْنُ آدَمَ** ، گووتی : بۆی باسکردین **عَبْدَةُ** ، لە **هِشَامٍ** ، ئەویش لە باوکیەوە، **ابْنِ عُمَرَ** دەڵێت: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕاوەستا لە سەر بیری (بدر) دا فەرمووی : ئایا ئەوەی الله بەڵێنی پێدان هاتە جێ؟ دواتر فەرمووی: ئەوان ئێستا باش گوێیان لێدەبێت لەوەی کە پێیان دەڵێم، دەڵێ ئەوە باسکرا لای عائشة ئەویش فەرمووی: بەهەڵەدا چووە ابن عمر، بەڵکو رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : فەرمووی : ئەوان ئێستا دەزانن کەوا ئەوەی من پێم دەگووتن ڕاست بوو، دواتر عائشة ئەو ئایەتەی خوێند : {إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى}.

**قال الكردي** : عروة بن الزبير دەڵێت ئەو فەرموودەیە بۆ عائشة باسکرا بۆ ئەوەی دڵنیا بنەوە کە ئایا شتێکی وا هەیە و تفسیر و شیکردنەوەی چۆنە و چۆن نیە.

واتە ئەوەی فەرموودەکەی باسکردووە هاوەڵە کە ابن عمر یەکێکە لەو هاوەڵانەی کەوا دوای ئوحد بەشداری زۆرینەی جەنگەکانی کردووە ، وە ئەوانەی تأکید لەو باسە دەکەنەوە.

تابعین خۆ وە نەبێت بڕوا بە عبدالله نەکەن ، نەخێر هەرگیز بەڵام بۆ دڵنیابوونیان کە ئەمە سیفەتی تێکڕایی هاوەڵان بووە ملکەچی تەواوی فەرموودە بوو.

**٤: قال** أبو داود بۆی باسکردین **النُّفَيْلِيُّ** ، بۆی باسکردین **زُهَيْرٌ** ، بۆی باسکردین **عَاصِمٌ الْأَحْوَلُ** ، گووتی : بۆی باسکردم **أَبُو عُثْمَانَ** ، گووتی: بۆی باسکردم **سَعْدُ بْنُ مَالِكٍ** ، گووتی:[١٦] گوێیەکانم بیستیان وە دڵیشم وەری گرت لە مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە فەرمووی : ( هەریەك خۆی بداتە جگە لەباوکی وە بشزانێت کە باوکی نیە ئەوا بەهەشت لێی حەرامکراوە)

دەڵێت: گەیشتم بە(أَبَا بَكْرَةَ)ئەو باسەم پێگووت ئەویش فەرمووی :گوێیەکانم بیستیان وە دڵیشم وەری گرت لە مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ , عاصم گووتی: ئەی باوکی عثمان دووکەس لەوێدا لەگەڵت ئامادە بوون کامیان بوون. فەرمووی: یەکێکیان ئەوە بوو کەوا یەکەم تیری لەئیسلام هاوێشت یان في سبیل الله ، (واتە سعد بن مالك ) ئەوەی تریان یەکێک بوو لە طَّائِفِ هوە لەگەڵ بیست و شتێک لە قەومەکەی هاتبوون.

أبو داود دەڵێت: النُّفَيْلِيُّ کاتێک ئەو فەرموودەیەی باسدەکرد دەیگووت: وَاللَّهِ ئەوە زۆر خۆشترە لام لە هەنگوین. واتە (حَدَّثَنَا وَحَدَّثَنِي).

**قال الكردي**: أبو عثمان النهدي: یەکێکە لە کباری تابعین کە پێی دەڵێن (التابعي المخضرم)، أدرك الجاهلية، وە یەکێکیشە لە راوی فەرموودە و ئیمام بووە، کاتێک هاوەڵی بەرێز (سعد) فەرموودەکەی بۆ باسدەکاتن، دواتر دەگاتە أبو بكرة دەڵێت شتێکی وام بیستووە؟ واتە بۆ ئەوەی بەتەواوی لەو شتە دڵنیابێتەوە.

[١٦]( البخاري ,٤٣٢٦ ٦٧٦٦ومسلم ٦٣و أبو داود ٥١١٣ و ابن ماجه ٢٦١٠ والدارمي٢٥٧٢ ، ٢٩٠٢ وأحمد ١٤٥٤ )

لێرەدا سعد مەبەستی (سعد بن أبي وقاص)ە چونکە، دواتر ڕوونی دەکاتەوە کەوا یەکەم تیری لەپێناو ئیسلام ئەو هاوێشتوویەتی کە ئەمەش تایبەتە بەو وە لەپێشووتر باسی ئەو فەرموودەیەمان کرد کەوا(ابن عمر) لە سعدی بیست دواتر لە باوکی(عمر) ی پرسیەوە ، ئیمام عمر پێی فەرموو: کاتێک سعد شتێکی باسکرد پێویست بە کەسی تر ناکات، بەڵام ئەم دینە بەو شێوە بووە وەهاتووە، چونکە کاتێک ئایەتی {إن جاءكم فاسق بنبإ } دابەزی لەسەر چاکترین سەدە بوو کە هاوەڵان بوو ، بۆیە زۆرێک بۆ دڵنیا بوون وە تێگەیشتن لە باسەکان بەو شێوە پێداگر بووینە.

وەخاڵێکی تری گرنگ:

ووتەی أبوداود کە دەڵێت: النُّفَيْلِيُّ کاتێک ئەو فەرموودەیەی باسدەکرد دەیگووت وَاللَّهِ ئەوە زۆر خۆشترە لام لە هەنگوین، واتە (حَدَّثَنَا وَحَدَّثَنِي).

ئەمە خۆشەویستی سەلەف دەردەخات بۆ ئەوەی دینەکەیان بە پاکی ڕاگرن چونکە ئەو جۆرە سەنەدا کە عنعنەی تێدا نیە یەکێکە لە بەرزترین سەنەدەکان وە پاکترینیان، چونکە زۆرینەی سەلەف سەنەدیان لەفەرموودە وەك دین سەیر کردووە، والله سبحانه وتعالى أعلم.

٥: **الترمذي** دەڵێت:[١٧] بۆی باسکردین **ابْنُ أَبِي عُمَرَ**، گووتی : بۆی باسکردین **سُفْيَانُ** ، ئەویش لە **عَبْدَةَ بْنِ أَبِي لُبَابَةَ** ، وَ **عَاصِمٍ** – **هُوَ ابْنُ بَهْدَلَةَ** –کە گوێیان لە سَمِعَا (**زِرَّبْنَ حُبَيْشٍ** ) بوو دەیگووت : بە (**أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ**) م گووت : براکەت ( **عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ**) دەڵێت : هەریەك ساڵێك هەوڵدا واتە بۆ لیلة القدر ئەوا دەیپێکێت ، أبيَّ گووتی الله لە باوکی عبدالرحمن خۆشبێت ، ئەو دەزانێت کەوا لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندایە وە شەوی بیست و حەوت بەڵام ئەو ویستوویەتی کەوا کۆڵ نەدەن ، زر دەڵێت : بە (أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ) م گووت بەچ شتێک ئەوە دەڵێیت ئەی باوکی الْمُنْذِرِ ؟ گووتی : بەو نیشانەی کەوا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هەواڵی پێداوین ، مەبەستی لەوەیە بەیانیەکەی کاتێک سەرەتا خۆر هەڵدێ جیاوازە لەڕۆژانی تردا.

**قال الكردي**: زِرّ بْنِ حُبَيْشٍ یەکێکە لەگەورە تابعیەکان ئیمام و ثقة بووە و گەیشتوە بە زۆرێک لەهاوەڵانی بەدر وەك عمر و ابن مسعود و علي ، وە هێندە شارەزا بووە بە زمانی عەرەبی.

وەك ابن حبان لە (الثقات ٤/ ٢٦٩) هێناویەتی کەوا یەکێک بووە لە شارەزاترین کەسەکان بەزمانی عەرەبی وە عبدالله بن مسعود پرسیاری لێکردووە لەبارەی عەرەبی.

بۆیە ئەو تابعیە بەڕێزە، لەبارەی شەوی(لیلة القدر) شتێکی بیستووە لە ابن مسعود کەدەڵێ ساڵەکە بەکاملی تأکید دەکاتەوە لای هاوەڵی بەڕێز(أبي) کە یەکێکە لە قارئ و مفسیرەکانی ئوممەت ، ئایا ئەو شتە چۆنە و چۆن نیە ، واتە بۆ دڵنیابوون و تێگەیشتن

---

[١٧] (مسلم ٧٦٢ و الترمذي ٧٩٣، ٣٣٥١ وأبي داود ١٣٧٨ وأحمد/ ٢١١٩١/ ٢١١٩٣ ٢١١٩٤)

لەوەی کە بیستوویەتی کە ئەنجامەکەی ڕوون بوو ساڵێك نیە بەڵکو مانگێکە لەنێو مانگەکەش دەشەوێکە لەنێو ئەو دە شەوەش شەوێکی تایبەتی داناوە.

**خاڵێکی تر** سەیری ئاداب و ڕەوشتی هاوەڵە بەڕێزەکان بکەن لەگەڵ یەکتردا، چەند بە ئسلوبێکی جوان پێی گووت: الله لە ابن مسعود خۆش بێت و خۆشی چاك دەزانێت ئەم دوو دێرە پێویستە جارێکی تر ئوممەت فێر بکرێنەوە لەوەی لەکاتێ نەپێکان و هەڵەدا بەو شێوە مامەڵە بکەین.

٦: **قال النسائي**: بۆی بسکردین **مُوسَى بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُوسَى الْبَصْرِيُّ** ، گووتی: بۆی باسکردین **النَّضْرُ بْنُ كَثِيرٍ أَبُو سَهْلٍ الْأَزْدِيُّ**، گووتی: کەوا نوێژی کردووە لە تەنیشت (**عَبْدُ اللَّهِ بْنُ طَاوُسٍ**) لە (مِنًى) لە نێو مزگەوتی الْخَيْفِ،دا ، دەڵێت:[18]

(ابن طاوس ) کاتێک سجدەی یەکەمی دەبرد و لەکاتی سەر بڵند کردندا دەستەکانیشی بەرز دەکردەوە تاوەکو ئاڕاستەی (سەری واتە ڕووی ) دەڵێ : من نکۆڵی ئەو شتەم لێکرد بە (وُهَيْبِ بْنِ خَالِدٍ) م گووت : ئا ئەو شتێک دەکات کەوا هیچ کەسێکم نەبینیوە بیکات: وُهَيْبٌ پێی گووت: تۆشتێک دەکەیت کەوا کەسمان نەبینیوە بیکات ؟ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ طَاوُسٍ پێی گووت :من باوکم بینیوە بەو شێوەی دەکرد ،وە باوکم گووتی : (ابْنَ عَبَّاسٍ)م بینیوە بەو شێوەی دەکرد، (عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ) گووتی من رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ م بینیوە بەو شێوەی دەکرد.

---

[18]( النسائي ١١٤٦ ، وأبو داود ٧٤٠ )

**قال الكردي:**

لەڕووی سەنەد : تصحيح كراوە لە لايەن بەشێک لە معاصرين وەك ألبانی و ئەوانی تر بەڵام چونكە رفع كراوە بۆ پێغەمبەر واتە (آثر مقطوع ) نيە بۆيە پێويستە راويەكان دانە دانە دەستنيشان بكرێن ، هەريەك لە أبو داود والنسائي هێناويانە بەڵام، (النَّضْرُ بْنُ كَثِيرٍ أَبُو سَهْلٍ الْأَزْدِيُّ) تێدايە (فيه مقال).

- ❖ (البخاري لە تأريخ الكبير دەڵێت : فيه نظر) (٨/٩١)
- ❖ والدارقطني دەڵێت : (فيه نظر)
- ❖ و ابن حبان لە المجروحين من المحدثين هێناويەتی (٢/٣٩١)
- ❖ وە هەريەك لە (أحمد بن حنبل وە العقيلي) تضعيفيان كردووە تەنانەت لە (المتأخرين) وەك (الذهبي لە (الكاشف)(٢/٣٢١) وابن حجر لە (تقريب التهذيب) تضعيفيان كردووە، بۆيە ئەو فەرموودە بەو سەنەدانە ( ضعيفة ) والله أعلم

**خاڵێك ئاماژە پێدەدەم:** لەنێوان ( المتقدمين والمتأخرين والمعاصرين ) نزيكترينيان لە حەق و صواب سەلەفە، دواتر (المتأخرين) نزيكترين لە پێكان وەك لە (المعاصرين)

لێرەدا باسی بەراورد كاری ناكەين چونكە ووردەكاری زۆری پێويستە بەڵام ئێمە ماندوو بوون و كاری هيچ لايەك بەكەم سەير ناكەين لە محققين و محدثە بەڕێزەكان ، بەڵام بەبەڵگەو بورهان بۆ خوێنەر دەيسەلمێنين كەوا مەنهەجی سەلەف لە تحقيق و تجريح و تعديل زۆر جياوازە لەگەڵ ئێستا دا والله تعالى أعلى و علم.

٧: **قال أبو داود** بۆی باسكردين **أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ** ، بۆی باسكردين **زَائِدَةُ بْنُ قُدَامَةَ الثَّقَفِيُّ** ، بۆی باسكردين **عُمَرُ بْنُ قَيْسٍ الْمَاصِرُ**، له **عَمْرِو بْنِ أَبِي قُرَّةَ** گووتی : حُذَيْفَةُ له (الْمَدَائِنِ) بوو ، باسی هەندێ شتی دەكرد كه رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەهاوەڵانی فەرمووە لەكاتی تورەییدا:[19]

ئینجا ئەوانەی كه گوێیان لەو باسه بوو لای( حُذَيْفَةَ ) چوونه لای( سلمان الفارسي) ئەو قسەیی (حذيفة) یان بۆ باس دەكرد، (سلمان) دەیگووت: (حُذَيْفَةَ) شارەزاتره بەوەی كه دەیڵێت.

ئەوانیش گەڕانەوە لای (حُذَيْفَةَ) و پێیانگووت: ئێمه ئەو باسەی تۆمان بۆ (سەلمان) باسكرد بەڵام نه (بەڕاستی دانایت وە نه بەدرۆ ) ئینجا (حُذَيْفَةَ) ڕۆیشت بۆ لای سلمان و پێی گووت: ئەی سەلمان، چ شتێك ڕێگرت بووە لەوەی دان به ڕاستی قسەكانی من بنێیت كەوا لەرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ م بیستووە ؟

(سلمان) فەرمووی : رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تورە دەبوو لەوكاته شتی دەگووت بەهاوەڵانی وە ڕەزامەند بوو لەوكاته دا لەسەر ڕەزامەندی قسەی دەكرد لەسەر هاوەڵانی درێژەی حدیث...

لەڕووی سەنەدەوە: رجالەكانی ثقەن و مقبولن ، وە متنی حديثة كەش هەریەك له، البخاري ومسلم وابو داود والنسائي واحمد وغيرهم، هاتووە.

[19] ( مسند آحمد ،٢٣٧٠٦ ، ٢٣٧٢١ , و أبي داود ٤٦٥٩)

دەڵێم: ئەو باسە یەکێک لە گەورە تابعیەکان باسی دەکات واتە دوای وەفاتی پێغەمبەر وە لەسەردەمی هاوەڵاندا، ئەوەی جێگای گرنگیە ، تابعین چۆن و بەچ شێوەیەك تأکید لەسەر ئەو فەرمودانە دەکەنەوە کەوا گوێیان لێبووە ، لەچ سەردەمێك لەسەردەمی باشترین چینەکانی مێژوو کەوا **هاوەڵانن پاکترین و ڕاستگۆترینیان.**

٨: **قال البخاري** بۆی باسکردین **آدَمُ** ، گووتی بۆی باسکردین **شُعْبَةُ** ، بۆی باسکردین **أَبُو قَيْسٍ** ،گوتی گوێم لە (**هُزَيْلَ بْنَ شُرَحْبِيلَ**) بوو گووتی : پرسیار کرا لە(**أَبُو مُوسَى**) دەربارەی( کچ وە کچی کوڕ وە خووشك ) فەرمووی:[٢٠]

(بۆ کچ نیوە ، بۆ خووشکیش نیوە ) بڕۆن بۆلای ابْنَ مَسْعُودٍ ئەو موافەقەی قسەکەی ئێمە دەکات، ئەوانیش پرسیاریان کرد لە ابْنَ مَسْعُودٍ وە قەولی(أبو موسى) یان پێگووت.

ابْنَ مَسْعُودٍ فەرمووی: بەڕاستی گومڕایی کردن وەمنیش هیدایەت دەر نیم ، من بەو شێوە بڕیار دەدەم وەك چۆن پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بڕیاری لەسەر داوە، بۆ (کچ نیوە ، بۆ کچی کوڕ شەش یەك تەواوکەری سێیەك، ئەوەی کە دەمێنێتەوە بۆ خووشك).

چووینەوە لای أبو موسى و قەولی ابن مسعود مان پێگووت، فەرمووی : چیتر پرسیار لەمن مەکەن لەکاتێکدا ئەو دەریای زانستە لەنێو تاندایە.

---

[٢٠] البخاري ٦٧٤٢ ، و أبي داود ٢٨٩٠ والترمذي ٢٠٩٣ وابن ماجه٢٧٢١ والدارمي ٢٩٣٢ , ٢٩٨٨ وأحمد ٣٦٩١ ، ٤٤٢٠ ).

دەڵێم: لەو نمونەش دا بەڵگەیەکی ترە بەوەی تابعین چۆن و بەچ شێوەیەک مامەڵەیان لەگەڵ هاوەڵان کردووە ، لەنێوان دوو لە باشترین و زیرەکترین صەحابی ئوممەت ، ابن مسعود وە أبو موسی ، بەڵێ بێگوومان ئەو وردی و لێکۆڵینەوەی ئەوان هۆکاری گومڕا نەبوونیان بووە ، چونکە هەموو کەس دوای پێغەمبەر قابیللی هەڵەیە وە دەیپێکێ وە ناپێکێت ، قەولی هەموو کەس قابیلی ڕەددە جگە لەسەروەر نەبێت ، کەواتە تۆی خوێنەر نەک نابێت بەڵکو بۆت نیە ملکەچی بۆ هەموو قیل و قالێک دەربڕی تاوەکو دڵنیا نەبیت و تەواو لێی نەکۆڵیەوە.

٩: ئیمامی مالك هێناویەتی لە أبي الزناد، کەوا گووتی :

(عمر بن عبدالعزیز) ٨٠ جەڵدی لە کۆیلەیەك (عبد) دا لەسەر بووختان پێکردن.

أبو الزناد گووتی : پرسیارم لە ( عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ) کرد لەو بارەوە ئەویش فەرمووی : من گەیشتووم بە هەریەك لە عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ، وعُثْمَانَ بْنَ عَفَّان و خەلیفەکانی تر هیچ یەکێکیانم نەبینیوە کەوا لە ٤٠ جەڵد زیاتر لە عەبد بدەن لەسەر بووختان.[٢١]

[٢١] (موطأ مالك ٢٣٩٥ و السنن الكبرى للبيهقي ،كتاب الحدود ١٧١٣٩)

**قال الكردي:**

ئەو آثرە ئیمامی مالك بە تفرد هێناویەتی لە كتب التسعة. وە لەڕووی سەنەدەوە سەنەدی صحيحة والله أعلم.

أبو الزناد: تابعیە لە ٦٤ لەدايك بووە لە ١٣٠ یان ١٣١ هـ وەفاتی كردووە.

عمر بن عبدالعزیر: تابعیە و یەكێكە لە خەلیفەكانی ئوممەت و هەندێک بە پێنجەم خەلیفەی دوای خلفاء الراشدي دادەنێن، لە ١٠١ هـ وەفاتی كردووە.

عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ: یەكێكە لە گەورە تابعیەكان وە هەندێک لە زانایان دەڵێن پێغەمبەری بینیوە، لە ساڵی ٨٥ یان ٨٩ وەفاتی كردووە ، ئیمام و ثقة بووە.

ئەوەی گرنگە دەبینرێ تابعین چۆن لەو شتانەیان كۆڵیتەوە كەوا لەبارەی دینەوە كراوە بۆ نمونە جەڵد دینە ، ڕاستە عمری كوڕی عبدالعزیز ، ئیمام بووە بەڵام ، بۆ دڵنیابوون و تاكید كردنەوە لەو باسە پرسیاری لە كەسانی لەو زیرەكتر و لەپێشتر كرد ، واتە ڕاستەو خۆ تصديقي ئەو فعلەی نەكرد ، كەوا بەڵای نامۆ بوو ، تاوەكو تأكیدی نەكردەوە ، وەک بینیمان دوای پرسین وپرسیار ، وەڵامەكەی جۆرێكی تر بوو.

كەواتە ئەوكات و لەو سەردەم و لەگەڵ ئەو جۆرە كەسە پاک و ئیمام و پێشەوایانە وا كرابێت ، چۆن و بەچ پێوەرێک ئێستا ئێمە نەیكەین و گوێی پێ نەدەین.

١٠: أَبِي مُرَّةَ مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِب پرسیاری له ئه‌بو هريرة كرد ده‌رباره‌ی( به‌رخێ یان مه‌ڕێ) كه‌وا سه‌ربڕاوه‌ ،یان خنكێنراوه‌ ، هه‌ندێكی ده‌جوڵێت ؟ ئه‌ویش ڕێگه‌ی پێدا كه‌وا بیخوا ، ئینجا دواتر پرسیاری له‌( زيد بن ثابت) كرد ئه‌ویش فه‌رمووی : مردوو ده‌جوڵێت و ڕێگه‌ی خواردنی پێنه‌دا.[٢٢]

**ده‌ڵێم:** أَبِي مُرَّةَ مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِب یه‌كێكه‌ له‌ تابعین ، پرسیار ده‌كات له‌ شتێكی دین له‌ یه‌كێک له‌ هاوه‌ڵان ، دواتر بۆ دڵنیابوون و یه‌قین ده‌چێت پرسیار له‌ یه‌كێكی تر له‌هاوه‌ڵان ده‌كات ، واته‌ باسه‌كه‌ له‌نێوان ( هاوه‌ڵ و تابعیه‌ ) ، ئه‌گه‌ر دیقه‌ت بده‌ن زۆرینه‌ی حاڵه‌كان له‌كاتی ووردبوونه‌وه‌ و به‌دواداچوونیان بۆ ئه‌و باسانه‌ ، ده‌بینرێ دوای لێكۆڵینه‌وه‌ گه‌یشتوون به‌ پێكان واته‌ ڕای صواب.

به‌داخه‌وه‌ ، موسڵمانی ئه‌مڕۆ له‌ دڵ سافی و ساویلكه‌یی خۆی و بێ ئاگایی له‌ پێشینه‌ چاكه‌كانی ئوممه‌ت ، له‌گه‌ڵ هه‌موو شنه‌بایه‌ک ڕووی ده‌گۆڕێت .

---

[٢٢] ( موطأ مالك ١٤١٠ )

١١: سُلَيْمَان بْن يَسَار دەڵێت: محمد بن الأشعث، هەواڵی پێدا کەوا مامۆژنەیەکی جوولەکەی هەبوو ، یان گاور ، مرد ، وە محمد بن الأشعث ، پرسیاری ئەوەی لە (عمر بن الخطاب) کرد و پێی گووت کێ میراتی لێدەگرێ ؟ ئیمامی عمر پێی فەرمو: ئەوانەی لەسەر دینەکەی ئەون میراتی لێدەگرن ، ئینجا دواتر چوو بۆلای (عثمان بن عفان) و پرسیاری لێ کرد لەو بارەوە؟ عثمان پێی فەرموو: ئایا وادەزانیت ئەوەی عمر پێی گووتیت لەبیرم نیە؟ ئەهلی دینەکەی میراتگرین.[٢٣]

١٢: إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَة پرسیاری لە سعید بن المسیب کرد دەربارەی شیرپێدان؟ سعید فەرمووی: هەموو ئەوەی کە لە پێش دوو ساڵەوەیە ئەگەر بێت و یەك پشکیش بێت، ئەوا حەرامی دەکات، وە هەرچی دوای دووساڵەوەیە ئەوا تەنیا خواردنێکەو خواردوویەتی، (ئیبراهیم ی کوڕی عوقبە) دەڵێت : ئینجا دواتر پرسیارم لە (عوروەی کوڕی زوبەیر) کرد لەسەر ئەو باسە، ئەویش هەمان ئەو شتەی گووتەوە کەوا سعید بن المسیب گووتی.[٢٤]

إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ: یەکێکە لە صغاري تابعین لەدوای ساڵی ١٤٠ وەفاتی کردیە ، پرسیار لە یەک باسی دین لە دوو لە گەورە تابعینی ئوممەت و فقهاء السبعة دەکات ئەوانیش:

(سعید بن المسیب) و (عروة ) واتە زیاتر و ووردتر دەیەوێت لەو لایەنە دڵنیا بێت بۆیە.

٢٣ (موطأ مالك ١٤٧٧ والدارمي ٣٠٣١ تا ٣٠٤٠ )
٢٤ ( موطأ مالك ١٧٧١، ١٧٧٢)

## لەکۆتاییدا

بەچەند آثرێک دەر ئەنجام بە کۆتا دێنین:

ئیمامی مُجَاهِدٍ دەڵێت : ( بُشَيْرٌ الْعَدَوِيُّ) هات بۆلای (ابْنِ عَبَّاسٍ) و دەیگووت قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ابْنُ عَبَّاس یش گوێی بۆ فەرموودەکانی نەدەگرت ، وتەنانەت سەیریشی نەدەکرد.

پێی گووت : ئەی ابن عباس چیە دەبینم گوێ بۆ فەرموودەکانم ڕاناگریت ؟ من لە رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وە بۆباسەکەم و کەچی گوێش ناگریت.

ابْنُ عَبَّاسٍ گووتی: ئێمە پێشووتر گەر گوێمان لە یەکێک بووایە بیگوتبا کە دەیگووت: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەوا چاوەکانمان تێدەبڕی و گوێیەکانیشمان بۆی ڕادەگرت، بەڵام کاتێ خەڵك چوە سەر زەلیلەو وەرماننەگرت لەخەڵکی ئیللا لەوەی کە دەمانناسی.

**قال الكردي:**

ئەوە بۆ ئەو کاتی کەوا سەردەمی صحابة بوو زۆر نزیک بوون لە پێغەمبەرەوە، جگە لەوەش کەمترین گرووپی گومڕا هەبوون ئەوکات، ئینجا بەو شێوە بوون، واتە نەهاتوون هەریەک بێت و بڵێ قال رسول الله ئەوانیش بڵێن ( صدق) بەڵکو لێیان کۆڵیتەوە و دڵنیابوون ئەوکات.

جگە لەوە هەتاوەکو کەسێکیان نەناسیبێت کەوا جێگای متمانە بووبێ ئەوا  نەک دینیان لێ وەر نەگرتوە بگرە وەک ابن عباس هەر سەیریشیان نەکردووەو گوێشیان لێ نەگرتیە.

بۆیە(ابن سیرین) کە هاوشانی پێشەوا حسن البصري بووە دەڵێت: ئێمە لەسەرەتا لە سەنەدمان نەکۆڵیەوە ، بەڵام کاتێک فتنە سەری هەڵدا گووتمان ناوی پیاوەکانتان بێنن، ئەوەی ئەهلی سوننە بوو وەرمان گرت ئەوی تر نەخێر.

بۆیە ئیمامی موسلم لە کتێبی (صحیح مسلم . مقدمة) بابێکی داناوە بەو ناونیشانە:

(ڕوونکردنەوەی سەنەد لەدینەوەیە، وە ڕیوایەت ناکرێ ئیللا لە کەسانی متمانە نەبن) وە(جرح)ی ڕاویەکان بەوەی هەیانە دروستە و بگرە واجبیشە، وە غەیبەتیش حەڕامکراویش نیە، بەڵکو دیفاعا لەشەریعەتی پیرۆز.

کەواتە بەزمانی حاڵی خۆمان بۆ ئەوەی خوێنەر تێبگات:

ڕوونکردنەوەی حاڵی ئەو کەسانەی کەوا بانگەواز دەکەن بۆ دین و خۆیان بەدین هەڵواسە ئایا جێگای متمانەن یان نا وەک ئیمامی مسلم و ئیمامی ئیبن مبارك دەڵێن: لەدینەوەیە.

هەروەها واجبە لەسەر ئەو کەسانەی کەوا الله علمی پێداون حاڵیان بەیان کەن.

ئایا دەکرێ دینیان لێ وەربگیرێ یان نا، ئەوەش نابێتە غەیبەت.

**بۆنموونه:**

قسەکردن لەو بابە لەسەرکەسانی ئاسایی و عەوام نیە بەڵکو لەسەر ڕاوی واتە (شێخ یان زانایە) بۆیە زۆرێک وا گوومان دەبەن، بە باسکردن و ڕوونکردنەوەو خستنە ڕووی کەم و کوڕیان و ئەو هەڵانەی کە کردیانە، ئێمە غەیبەتیان دەکەین ،نەخێر بگرە واجبە جگە لەوەش : دیفاعە لە سوننەت و شەریعەت.

ابن عون دەڵێت:

ئەیوب فەرموودەیەکی باسکرد لای محمد بن سرین لە أبو قلابەوە ، فەرمووی : ئەبو قلابە إن شاء الله پیاوێکی چاکە ،بەڵام ئەبو قلابە لەکوێی ڕیوایەت کردووە .؟

محمد بن سيرين دەڵێ:

کەسی وا هەیە فەرموودەیەکم بۆ باس دەکات لە کەسێکی ترەوە، من تۆمەتباری ناکەم، بەڵام ئەوە تۆمەتبارەکەم کەوا بۆم باسدەکات.

يزيد بن هارون دەيگووت:

سليمان التيمي , فەرموودەیەکی باسکرد لە ابن سيرين.

ابن سيرين پێی گووت: لەخوا بترسەو درۆ بەدەممەوە مەکە، بە سلیمان گووترا، ئەویش فەرمووی، ئای لەوە، ئەوە بانگبێژێک بۆی باسکرد چی لێهات؟

بانگبێژ هات و سلیمان پێی گووت ئایا تۆ فەرمووده‌ت لە ابن سیرین هەوە بۆ باسنەکردین بەوە و بەوە.

بانگبێژ گووتی: ئەوە پیاوێک بۆی باسکردم لە ابن سیرین.

(هەرسێ باسەکە هاتوە لە: الضعفاء الكبير للعقيلي ، مقدمة)

**قال الكردي:**

لەو نمونانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دوای هاوەڵان تابعین و قوتابیەکانیان هەمان ڕێچکەی ئەوانیان گرتوە لە فەرموودە واتە ڕاستەوخۆ بەهیچ جۆرێک قبوڵی فەرموودەیان نەکردووە ئیللا دوای لێکۆڵینەوەی وورد ئینجا بڕیاریان داوە.

کەواتە گەر بۆ ئەوکات و ئەوان وابووبێت ئەی بۆ ئێستا زۆر زیاتر پێویستترە ، بۆیە پێویستە و دەبێت موسڵمان هۆشیار بێت ووردبێت لەو باسە واتە (قبوڵ کردنی علم ) چونکە دینە ئەوکات کەس زەرەر ناکات ئیللا خۆت نەبیت ، سەیری سەلەفی خۆت بکە هەر لە پێغەمبەر و هاوەڵان و تابعین و أتباعیان ئەوان بەو شێوە بوون بۆیە کەمترینان تووشی بەلا ڕێدا بردن ئەچوون و لەگەڵ هەموو شنە بایەکی کەمی فتنە لار نەدەبوونەوە ، وەک ئێستا.

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**